| شیعر |

# عەورەتی نیشتمان

محسن شوانی



ناوی کتێب – **عەورەتی نیشتمـان**

ناوی نووسەر – **محسن شوانی**

بابەت – **شیعر**

دیزاین –  **محەمەد جەبار**

ساڵی چاپ – **٢٠٢٢**

نۆبەتی چاپ – **چاپی یەکەم**

چاپخانە - **چوارچرا**

تیراژ-  **٥٠٠ دانە**

ژمـارەی سـپاردن: لـە بەڕێوەبەرایەتـی کتێبخانـە گشـتییەکان، ژمـارەی سـپاردنی(١٢٧) سـاڵی (٢٠٢٢) ی پێـدراوە.

# پێڕست

## بەشی دووەم

# پێشەکی

**«شیعر ئەو بوڕکانەیە، کە هەمیشە هەڵگیرساوە»**

موحسـین شـوانی یـەك لـە شـاعیرانی جیـلی سـێیەمی شـیعری هاوچەرخـە، جیـلی یەکـەم فەرهـاد شـاکەلی و لەتیـف هەڵمـەت و شـێرکۆ و پەشـێو و چەنـدانی تـرن، ئەوانـەی لـە حەفتایـەکان بەیاننامـەی هاوچەرخـی جۆرێـکی تـازە لـە داهێنـانی شـیعرییان نـووسی، جیـلی دووەم ئەنـوەر مەسـیفی و صەبـاح ڕەنجـدەر و نـەوزاد ڕەفعـەت و سـەعدوڵڵا پـەرۆش و زۆرێـکی تـرن، کـە لـە هەشـتاو نەوەتـەکان بـەدەر کەوتـن، ئەگەرچـی پێشـتریش شـیعریان نووسـیبێ، موحسـین شـوانی دەکەوێتـە جیـلی سـێیەم و لـە پـاش ئەوانـەی جیـلی دووەم دێـت، لـە شـاعیرانی هاوچەرخـی کـورد، لـە کۆتایـی نەوەتـەکان و سـەرەتای دوو هـەزارەکان دەرکـەوت.

موحسـین شـوانی بـە خوێنێـکی گـەرم و بـە جۆرێـك لـە تووڕەیـی دەنووسـێت، بیـری ئاگرینـەو ئەوشـتەی لێـی تووڕەیـە، بـە تونـدی دەیگەیەنـێ.

عـەورەتی نیشـتیمان ناونیشـانی دیوانـە شـیعرێکی نوێیـەتی، دوو بەشـە، بەشـی یەکەمـی سـیاسی و بـەشی دووەمـی

ئاینییە، لە شیعری (عەورەتی نیشتیمان)دا، کە ناونیشانی دیوانەکەشی لە ناونیشانی ئەم شیعرەوە وەرگرتووە، شیعرێکی سیاسیە، تیایدا بە ئاشکرا واقیعی نیشتمان دەنووسێ و بێزارە لەو واقیعە سیاسی و کۆمەڵایەتیەی هەیەتی، ئەوەتا نووسیویەتی:

ئەی نیشتمان!

چەند تامەزرۆی دیدارت بووم....

لەغوربەتا بەحەسرەتی پیاسەیەکی

ئێوارانی بەردەم سەرا و قەڵا و باتە و

ناو شارت بووم ....

ڕۆژم ژمارد...

مانگم ژمارد، ساڵم ژمارد...

هەر لەبیری گەڕانەوەی ئامێزت بووم

کە هاتمەوە ئاخ چم بینی!

وەك سۆزانی لەباوەشی

نێرەکەرێ ڕاکشابووی،

ببوویە ئالیك

لەئاخوڕی دوو حزبدا

بە بەرچاوی ڕۆڵەکانت

کڕ کرابووی!

کاتێکیش مەدحی شتێك بکات، هەر بە سۆزی زۆرەوە مەدحی دەکات، ئەوەتا لە مەدحی هەولێردا، دەنووسێ:

ئەو هەولێرە

پڕ پەشێوە

پڕ سەرداری سەعید سۆفی و

خەجە باوە و پیاوی شێرە

لە شیعری (هەرێم)شدا بە ڕەشبینیەکی ڕۆمانسیانە و هاوچەرخانە، ئامۆژگاری بەرانبەرەکەی دەکات و داوای لێدەکات، سەرهەڵگرێ و ئەو وڵاتە جێبێڵێ، چونکە خێری تێدا نەماوە.. ئەوەتا دەڵێ:

بڕۆ لێرە

ئیتر ئێرە

نە هەناسەی عەشق و جوانی

نەگوڵ نە پەپولەی لێ یە

سەر هەڵگرە

مەملەکەتی خەم وئازار جێ بهێڵە

بەسەردانیش

هەرگیز مەگەڕێوە بۆ ئێرە

لــه شــیعری (ئیلاهــی)دا، شــاعیر بیــری ئــەو هەقیقەتــە بڵاودەکاتــەوە، کــە: غەیــری دەرگای خــوای گــەورە، هەمــوو دەرگایــەك بــۆ ئینســان داخــراوەو لــە کاتی پێویســتدا کــەس بــە خــۆت ناگــرێ، خــوای گــەورە نەبــێ.. ئەوەتــا بــە زمانێــکی ڕوون دەنووســێ:

ئیلاهی

هێندەم لەدەرگای غەیری تۆدا

رووم نیە بێمە دەرگات

گەرچی دەرگات

واڵایە لەسەر پشتە هەمووکات

لــە شــیعری (پەرستن)یشــدا، دەقئاوێزانێــکی تــەواو بــە گوتەیــەکی ئەمیــری ئیمانــداران عــەلی کــوڕی ئــەبی تالــب دەکات (ڕەزای خــوای لێبــێ)، کــە ئــەو گوتبــووی: ئــەی خودایــە، نــە لــە تــرسی ئاگــر و نــە لــە خــۆشی بەهەشــت مــن تــۆ ناپەرســتم، هــەر لەبــەر ئــەوە تــۆ دەپەرســتم، چونکــە تــۆ خــودا و خالــق و ڕازقــی منــی و شــیاوی ئــەوەی مــن بەنــدەی تــۆ و تــۆ خــودای مــن بی و بتپەرســتم... ئەوەتــا موحســین شــوانیش دەڵــێ:

پەرستن

نە لەترسی دۆزەخ

نە لەخۆشی بەهەشت

تۆ ناپەرستم

تۆ خودامی

خۆشم دەوێی

هەر لەبەرخۆت

دەتپەرستم

شـیعری (دایـك)، سـۆزی خـۆی بـۆ دایـك دەنووسـێ لـە و شـیعرێکی جوانـە، تیایـدا، واقیعـی کۆمەڵایـەتی و ئاینـی پێکـەوە تێکەڵـدەکات، دەنووسـێ:

وەرە و ئەمشەو میوانم بە

سەر دەنێمە ژێر هەردوو پێت

چەند تا مەزۆری ئەوینێکم

بۆنی بەهەشت لەژێر پێی بێت!

تەنها یەك شەو میوان بە

بۆنی سینە و خەنە و مێخەك

بەسەرمدا ببارێنە

شەوێ وەرە و

بەلای لایە
لەباوەشی میهرەبانیت
بەئارامی بمخەوێنە
وەکو سەردەمی منالّی
هێدی هێدی
دەست بە سەر و ڕووخسارمدا دابهێنە
شەوێك وەرە
هەرچی خەمی تەمەن هەیە
لەئامێزی دایکایەتیت
بەبێ دەنگی بڕەوێنە.

ئەم بەشەی شیعرە کۆمەڵایەتییەکانی لە شیعرە سیاسیەکانی جوانترن، بەوەی کەوا لەم بەشەدا ڕەگەزی سۆز باڵایەو لە بەشی یەکەمدا ڕەگەزی حەماسەت زیاترە، دیاریشە حەماسەت شیعر لە سۆز دادەبڕێ و سۆزیش شیعر تەڕ و خۆش دەکات.

موحسین شوانی لەسەر ڕێبازی پەشێوە لە شیعر نووسین و زۆر عەشقی کێش و سەروایە،

ئەوەتا لە شیعری (میوان)دا، هەر ئسلوبی پەشێوی هەڵگرتووە..

ئەگەر هاتن

لێم مەپرسن

وڵاتەکەت لەسەر نەخشە بێ سنوورە، بەبێ خاڵە

بۆ نازانن سەدان ساڵە خانەخوێمە و

هەر دوژمنیش خاوەن ماڵە؟!

ئەمەی هەر لەو شیعرەی پەشێو وەرگرتووە، کە دەڵێ:

سەدان ساڵە لە وێرانەی ماڵا خۆمدا

کتکە کوێرەی گۆشەی مەتبەخی سوڵتانم.

بەڵام ئەو عاشقیەتەی کێش و سەرواش وایکردووە، لە ڕووی زمانەوە، زۆر جار غەدر لە زمانی دەربڕین بکات، یان بە واتایەکی تر زمان فریای نەکەوێ و مانا بە هەڵواسراوی بمێنێتەوە، ئەوەتا تەماشی ئەم کۆپلەی دواینی شیعرەکە بکەوە:

ئەی نیشتمان!

خۆزگە بەم شێوە نەمدیبای

چەند بێزاربووی

خۆتاقەتی داپۆشینی عەورەتەکەی خۆتیش نەبووی

ئـەم ڕسـتەیەی دوایـی (خۆتاقـەتی داپۆشـینی، عەورەتەکـەی خۆتیـش نەبـووی)، ئەمـە چەنـد بـە زەحمـەت واتـا دەگەینـێ؟!
ڕاسـتە شـاعیر بـۆی هەیـە لادان لـە زمـان بـکات، بـەڵام بـەو شـێوەیەی دەربڕیـن ئاسـایی بمێنتـەوەو واتـا بـە هەڵـواسراوی بەجێنەمێنـێ، بـەڵام ئـەو لادانـەی لێـرە کـراوە، لـە ڕاسـتیدا درووسـت دەبـوو بڵـێ: خۆتاقـەتی داپۆشـینی، عەورەتەکـەی خۆشـت نییـە! ئەمـە درووسـتەو جوانـە، بـەس بۆچـی وەهـای نەنووسـیوە، چونکـە خـۆی بـە قافیـە بەسـتاوەتەوە، قافیـەش وای کـردووە، بـەو شـێوەیە لادان بـکات.

دیسـانەوە لـەم شـیعرەی (مارنج)ـەدا، هەمـوو ڕسـتەکانی بـە شـێوازی مەرجـی نووسـیوەو لەسـەر ڕسـتەی یەکـەم بینـای کـردوون، کـە ڕسـتەی فرمـانی مەرجـە، ئیـدی تـەواوی ڕسـتەکانی دیـشی ڕسـتەی فرمـانی مەرجـن، ڕسـتەی فرمـانی مەرجیـش پێویسـتی بـە ڕسـتەی وەڵامـی مـەرج هەیـە، بـەڵام ئـەو شـیعرەکەی تەواوبـووەو چەندیـن ڕسـتەی فرمـانی مەرجـی لـە دوای یـەك ڕیزکـردووەو هـەر ڕسـتەی وەڵامـی مەرجـی نەنووسـیوە، خـۆ مـن دەزانـم بـە تەنیـا ڕسـتەی یەکەمـی لـە ئەساسـدا فرمـانی مەرجـەو لـە نییـەتی ویـدا، لـە ڕسـتەی دووەمـدا کردونەتیـە ڕسـتەی وەڵامـی مەرجـی، بـەڵام واقیـع و بنیاتـە سینتاکسـیەکەی ڕسـتەکانی پێـمان دەڵـێ

ڕستەکانی هەمـــووی فرمـــانی مەرجـــن و ڕســـتەی وەڵامـــی مەرجیـــان تیـــا نییـــە.. ئەوەتـــا بخوێنـــەوە:

گەر دەمتوانی وەك خۆڵ و کا

تێکەڵتان کەم

وەك قوڕەسوور

لە قالبی خشتتان بدەم

لە قولینچی دیواری ماڵە هەژارێك

هەموو ساڵێك لە پێنجی سێ

بە مارنجی کوردەواری

سواغتان بدەم

هیـــوای تەمـــەن درێـــژی و بەرهەمـــی دیکـــەی بەپێـــز بـــۆ بـــرای شـــاعیرم موحســـین شـــوانی دەخـــوام..

کورد سەربەرز و کوردستان ئاوەدان.

هەولێر شەوی شەممە لەسەر یەکشەممە

١٩لەسەر٢٠/ شوباتی ٢٠٢٢

د. ئیدریس عەبدوڵڵا

نیشتمـان چی یه؟
ماکەرێکی بێ کورتانی
سەر جۆخینی
ئاغایەکی ساختەچی یه!

## مارنج

گەر دەمتوانی وەك خۆڵ و کا
تێکەڵتان کەم
وەك قورەسوور
له قالبی خشتتان بدەم
له قولینچی دیواری ماڵه هەژارێك
هەموو ساڵێك له پێنجی سێ
به مارنجی کوردەواری
سواغتان بدەم

## عەورەتی نیشتمان

ئەی نیشتمان!

چەند تامەزرۆی دیدارت بووم....

لەغوربەتا بەحەسرەتی پیاسەیەکی

ئێوارانی بەردەم سەرا و قەڵا و باتە و

ناو شارت بووم ....

ڕۆژم ژمارد...

مانگم ژمارد

ساڵم ژمارد...

هەر لەبیری گەڕانەوەی ئامێزت بووم

کە هاتمەوە ئاخ چم بینی!

وەك سۆزانی لەباوەشی

نێرەکەرێ ڕاکشابووی،

ببوویە ئالیك

لەئاخوڕی دوو حزبدا

بە بەرچاوی ڕۆڵەکانت

کڕ کرابووی!

ئەی نیشتمان!
خۆزگە بەم شێوە نەمدیبای
چەند بێزاربووی
خۆ تاقەتی داپۆشینی
عەورەتەکەی خۆتیش نەبووی .

## هەولێر

ئەو هەولێرە
پڕ پەشێوە
پڕ سەرداری سەعید سۆفی و
خەجە باوە و پیاوی شێرە
لەدوورەوە لێی مەڕوانن
کێ بوێرە
بێتە ئێرە
ئەوسا لێرە
پڕ بەدەنگی هاوار دەکات
سەرۆك زێڕە!

٢٠٢٠/٧/١

## جاش

من دوێنیم بیرچۆتەوە

کەسیش نا ناسمەوە نە خراپ، نە باش

تەنها دەزانم هەردوولا

ریشدار و چڵکن و دەست بەتفەنگ و

رانکوچۆغە لەبەربوون

پێیان دەگووتن (پێشمەرگە)

پێیان دەگوتن (جاش)

ئێستا هەردووک ئاوێتەبوون

لەنێو حەفتا و لەناو هەشتاش!

٢٠٢١/٢/٦

## کوردستان

هەموو شەوێ نیشتمانم

لەبازاڕی سیاسەت و

هەوەس بازی حزبەکانی

هەڕاج دەکرێ ....

هێندە ئابڕوی لێ تکاوە

شەوانە لای بەرپرسەکان

لەسەر سینەی قومار دەکرێ!

٢٠٢٠/١١/١٥

## هەرێم

برۆ لێرە

ئیتر ئێرە

نە هەناسەی عەشق و جوانی

نەگوڵ نە پەپولەی لێ یە

سەر هەڵگرە

مەملەکەتی خەم وئازار جێ بهێڵە

بەسەردانیش

هەرگیز مەگەڕێوە بۆ ئێرە

چونکە ئێرە

نە نەمامی خۆشەویستی لێ شین دەبێت

نە بەرهەمی برایەتی لێ دەڕوێت

نە پیاو لێرە بوێرە

نە ئافرەت لێرە زێڕە!

## چڵکی شاخ

ئەوانەی دوێنێ بە قرێژی
براکوژی شاخەوە
بەجلی شڕ و کەوشی دڕاوەوە
لەو دیو سنوور گەڕانەوە
هەرچی جوانی نیشتمان بوو
لەخۆیان سوو
کەچی هەرپاك نەبوونەوە
دڕنی و پیسی
گەندەڵیان بەو میللەتە دەفرۆشنەوە!

## هەڵبژاردن

سەری پەنجەی مۆرکراومان
بقرتێنن
ئەگەر وویستیان
جارێکی تر
بۆ لەتێ نان
درۆی سەردەم
بنەخشێنن

## بەراوورد

نیشتمان ئەوسا خۆش بوو

لەڕق و ترسی دوژمن

لەسەر دیواری گەڕەك و قوتابخانە

دەماننووسی: (بژی پێشمەرگە، بڕوخێ بەعسی)

بەڵام ئێستا

لەترس و ڕقی دەسەڵاتی کوردی

لەسەر دیواری ناو دەستخانەکان دەنووسین:

(بڕوخێ حزب وسەرکردە و کورسی )

## دەسەڵات

هەرچی جوانی و پاکی هەبوو لێتان سەندم

دونیایەك ناشرینیتان بۆ بەجێ هێشتم

شیرینی تەمەنم

پێشکەش کردن

ژەهری ڕۆژگارتان پێ چەشتم

هەولێر

٢٠١٩

## میوان

ئەگەر هاتن
لێم مەپرسن
وڵاتەکەت لەسەر نەخشە بێ سنوورە، بەبێ خاڵە
بۆ نازانن سەدان ساڵە خانەخوێمە و
هەر دوژمنیش خاوەن ماڵە؟!
ئەگەرهاتن
ووڵاتەکەم بێ پاسەوان ....
بێ سانسۆرە
ئاگاداربن!
دز و جەردەی گەلێ زۆرە
دزی ئێمە
شەیدای زێڕ و دۆلار نییە
دزی ئێمە
گیرفان بڕەی بازار نییە
چەتەکانمان هەموو خەمیان
هەر دزینی ئازادیە
هەر بڕینی ئەو زمانەی
فێرە هەق بێژی و ڕاستی یە!

## کۆچ

ئەی نیشتمان!

زوویر مەبە

بە ناچاری بەجێت دێڵم،

ڕێگەی مەرگی هەندەران و

سەختی غەریبی دەپێوم ...

زۆر دەمێکە بەدوای نان و ئازادیدا،

بستێ خاکدا وێڵم،

تا بیکەمە لانەی ئارام

لە ئامێزی بێ خەم بنووم،

ئەی نیشتمان!

لەوەتەی هەم بۆ من نەبووی

ئاسوودەییت پێ نەداوم

ئیتر دەڕۆم

لەغوربەتا دەمێنمەوە هەتا ماوم.

٢٠٢١/١١/١١

هەولێر

## مەملەکەتی هەڵپەڕین

دەی هەڵپەڕن
بە ئاوازی تیاترۆکانی تاتلیسیزم
لە هەرێمی نەوت و
خوێن پاشەکەوت و گەندەڵیزم
سەرقاڵیان کەن بە ڕیتمی شڕ
بە گۆرانی ئاخوندەیی و کەمالیزم
بەردەوامە شەڕی شاخ و برا کوژی و
بەعس و جاش و ئەنفالیزم

هەولێر
٢٠١٩/١٢/٧

## ئەی نیشتمان

بەقەد دایکم خۆشم دەوێی
بەقەد باوکم ڕێزت دەگرم
هەتا ماوم
لەگلێنەی چاوی خۆمدا
هەڵتدەگرم
ڕۆژێ سەدجار
لەپێناوت دەژیم، دەمرم

## گەرانەوە

بمبەنەوە بۆ منالْی

بەرائەتی ئەو سەردەمەم بدەنەوە

بمبەنەوە بۆ منالْی

چلکی حیزب و

موونافیقی سیاسەتم لێکەنەوە

لە کۆڵ پیسی و درۆی ڕۆژگاری

خۆپەرستیم بکەنەوە

لەنێو بەندی ژینی ساختە و

مۆدێرنی تەکنەلۆژیا ڕزگارم کەن

بمبەنەوە بە خۆڵ و گلی پاکی

کۆڵانەکانی گەڕەك بمشۆنەوە

لە هەموو گوناهەکانی تەمەن پاکمکەنەوە

٢٠١٩/٧/٢٢

## رووفات

ئەم کاتژمێرە
ئەم جووتە پێڵاوە
بکەنە مەدالیای ناپاکی
لە بەرۆکی جاش و ئەنفالچیەکان هەڵیبواسن
یان بیکەنە هێمای ڕیسوایی
بیدەن لە ڕووخساری
ئەو بەرپرسانەی
خانەوادەی ئەنفال ناناسن

هەولێر
٢٠١٩/٧/٢٤

## ئومێد

لێرە ناڕۆم
ئەم هەوارە جێ ناهێلم
کەی توانیتان تیشکی خۆر و ڕووناکی مانگ
بشارنەوە
ئەوسا دەڕۆم
بە ڕێکەوتیش
سەر لەم خاکە پڕ گەندەڵە نادەمەوە

٢٠١٩/١١/٩

## مەملەکەتی سووتان

نیشتمان بۆتە دۆزەخ

گڕ لە جەستەی دەبارێ

خەریکە بسووتێنێ تەڕ و ووشك بە جارێ

دەغڵ و دان و خەرمانی جوتیار

کۆگای چەك و تەقەمەنی

بەندیخانە و ساردەمەنی

جەرگی دایك و باوك و نەدار

ئاگری نا دادپەروەری

بەربۆتە گیانی باش و لاسار

خودایە هانا

لەم دۆخە دەرمان بێنە

تەنها یەکجار

## پێناسە

ئێوە کێنە؟
تێکۆشەری بندیوار و
شۆرشگێری ترسنۆکی ئەم گەلەنە
ئێوە کێنە؟
نێرەکەری بێ کورتانی
بەگ و ئاغای کامە دێنە
ئێوە کێنە؟
نۆکەری کام ئاخوندەنە؟
ئەلقە لە گوێی کام سوڵتان و
ئال و شێخی چواردەورەنە
سواڵکەری بەر دەرگای پاپا و
کام کەنیسە و کام قەشەنە
ئێوە کێنە؟
بووکەڵەی بەر دەستی ناحەز
رێوی دوژمن
شێری ناوخۆ و
شەیدای مێینە

ئێوە کێنە؟

درووستکەری جاش و ئەنفال

شەری شاخ و وێرانینە

ئێوە کێنە

داهێنەری برا کوژی و دوو هەرێم و گەندەلینە

هەولێر

٢٠١٨/١/١٦

## هاوارتە لەمن ڕۆژئاوا

کوردە یەکگرن کاتی هەڵوێستە

دیندار و بێ دین ببنە یەك دەستە

پشتت بە ناکەس هەرگیز مەبەستە

بەرامبەر دوژمن وەك شێر بووەستە

کوردە هەتا کەی ئەم جیاوازی یە؟

برایەتیهان شین و شاییە

دوژمنتان زۆرە بێ کەس و دۆستن

دەست خەنە ناو دەست ئیتر مەوەستن

پشت و پەناتان بەخوا ببەستن

برا بن برا ئێوە سەرکەوتن

٢٠١٩/١٠/١٢

## ڕاپەڕین

نەکەن ئەمجارە ڕاپەڕن

بە ئاوازی درۆی حیزب

هەڵنەپەڕن

هەڵنەخەلەتێن

هوتافی شەڕ

برا کوژی

لە بازاڕی سیاسەتی کوردەواری

بە دراوی قەلپیش مەکڕن

دوێنێ شێری شاخ و کێو بوون

ئەمڕۆ فێڵبازی مۆدێرن

دەستکەوتەکانی ڕاپەڕین

بۆ نەوەی نوێ وا دەژمێرن

نەوت دز و شا گەندەڵن

گیرفان دڕن گیرفان بڕن

گیرفان پڕن

سەر و سمێڵ ڕەشکراوی فشەکەرن

ئەوسا کەر و

ئێستا خاوەنی کۆپتەرن

لەسەر پارە و پلە و پایە

لە شەڕە پۆست ئازا و دڕن

لە بەرامبەر دوژمن کڕن

گوێ لە میللەت هەر ناگرن

ئەی گەل ئێوەش لە داخانا

یەخەی خۆتان گشت دادڕن

هەولێر

٢٠٢٠/٣/٥

## دوژمن

هەڵە نەکەن

دەستی ڕەشتان

بۆ بستێکی نیشتمانە بێ نازەکەم

درێژ بکەن

ئاگادار بن

کوردستانم گۆڕستانی

بێگانەیە

بۆ بەرگری خاك و خەڵکی

دار و بەردی ئەم هەرێمە

پێشمەرگەیە

## زەمانە

دەڵێن جام پڕ بێت لێی دەڕژێتەوە

ئابڕوو کە تکا کۆ ناکرێتەوە

تفی سەر هەوراز بۆ ڕووت دێتەوە

شوشەی شکاویش چاك ناکرێتەوە

میللەتی مردوو هەڵناستێتەوە

مێژوو بە کۆیلە نانووسرێتەوە

گیرفانی دڕاو  پڕ نابێتەوە

پارە لە قاسە کۆدەکرێتەوە

حیزبی بێ هەڵوێست خۆی دەتوێتەوە

حوکمەتی گەندەڵ دەپووکێتەوە

چرای دزراویش دەکوژێتەوە

گۆڕی بێ ڕووناك قەت ناکرێتەوە

هەولێر

٢٠٢٠/٣/١١

ئیجە

بە هێواشی بەسەرتدا گوزەر دەکەم

مەمخنکێنە

نیشتمانم لە دەست داوە

بەدوای بستێ خاکدا وێڵم

شەپۆڵ مەدە

هەر ئەمجارە و نایێمەوە

نامۆم لێرە

ناخت مەکە بە گۆڕستان

تورە مەبە

بە ئارامی

ببە پردی پەڕینەوە

هەولێر

٢٠١٨/١٠/١٧

## بێ ئاگا

میللەتێکی بێ سەرکردەین
چیرۆکێکی بێ سەرەتاین
کۆتایەکی بێ پاڵەوان
پاڵەوانێکی ترسنۆکین
ترسنۆکێکی شەڕ خواز
شەڕ خوازێکی دۆڕاوین
پەرتووکێکی بێ ناونیشان و
ناوەڕۆکین
گۆڕمان بۆ دوا ڕۆژ هەڵکەندووە
دۆڕاوێکی گەندەڵین
گەندەڵێکی بێ باکین
بێ باکێکی ڕەشبینین
بێ متمانە و قیناوین
لەنێو کفنی مردوو دا زیندووین
شانازی بە هەژارییەوە دەکەین
هەژارێکی لووت بەرزین
لەبێ ئاگایی خۆمان ئاگای دەوروبەرین
مێژوو دمێکە دەماننووسێتەوە

کەچی ئێمە تەمبەڵین ناخوێنینەوە

نەمامێکمان بە دەستە

چاوەڕوانی جاری کۆتایی ژیانین

تا بینێژین

پێویستمان بە خۆمانە

خۆمان و بەس

لە خەوی بێ ئاگایی

بە ئاگامان بێنێتەوە

لە پردی ڕەشبینی

بمان پەڕێنێتەوە

هەولێر

٢٠٢٠/٤/٤

## برایەتی لەسەردەمی ناپاکیدا

خۆزیا دیوار گوێی دەبوو
تا نهێنیەکانی ئێوەی دەبیست و
بۆ هەمووومانی دەخستە ڕوو
ئەگەر دەبوو
خاك شوێن پێی
نا پاکانی هەڵدەگرتوو
سنور دڵی دایك دەبوو
بە فیراقی نەوەکانی
گڕ لە جەستەی بەردەبوو
خۆزیا نیشتمان هەستی بینینی دەبوو
بە چاوی خۆی چەواشەکاری
هەردوو دیووی
لا دەبوو
ئەگەر دەبوو
داوام دەکرد
قەندیل بێتە گۆ
نەفرەت بکات لە دووڕوویی و درۆ

خۆزگە دەبوو
دڵنیام هەرگیز نیشتمان
بێ دەنگ نە دەبوو
نەدەمرد لەسەردەمی متمانەی بەسەر چوو

هەولێر
٢٠٢٠/٤/١١

## ریسوایی

من ئێستا بێ نیشتمانم
بەڕۆژ سێدارەی ئاخووندە
بەشەو لەباوەشی سوڵتانم
خودایە!
دەمەوێت لەوادەی خۆمدا
زووتر بمرم
بەرگەی ڕیسوایی و
مەرگی نیشتمان ناگرم.

## پێشمەرگە

چەکەکانتان بکەنە شان

ڕانك و چۆغە و

پشدێن و کۆڵ

مەتارەی ئاو

جبەکانتان هەڵگرنەوە

بۆینباغ و بۆن و تەلار

کورسی و یانە و وەنەوشە و شار

بۆ دزەکان بهێڵنەوە

ئاو و کانی و دۆڵ و چیا

بانگتان دەکا

بۆ شۆڕشی کورد بوونەوە

پاکبوونەوە لە گەندەڵی

لە ناپاکی دەسەڵاتی بۆگەنەوە

حیزبی بوون و

دەستکەوتی ڕاپەڕینەوە

٢٠٢٠/٥/٢٧

## پایتەخت

شار پڕ زیندووی مردووە

گۆڕستانێکی گەورەیە ئێرە

بۆ زیندووە کاوێژکەرەکان

بۆماستاوچی وکاسەلێسە قەلەم فرۆشەکان

شار پڕ باخچە و پاڕکی ڕەنگا و ڕەنگی

بێ پەپوولەیە

ئەم شارە

پڕ دشداشە و سێ چارەك لەپێ یە

تەنها من و پەشێو و سەردار

نامۆیین لێرە

بۆنی بێگانەی لێدێ

ئەم هەولێرە!

## فریای ئابڕووی نیشتیمان بکەون

نیشتیمان چی یە؟
ماکەرێکی بێ کورتانی
سەرچۆخینی ئاغایێکی ساختەچی یە!
نیشتیمان نەرمونیانی
مێینەیی لەدەست داوە
میهرەبانی دایکایەتی پێ نەماوە
گەر فریای نەکەوین
دەبێتە سۆزانی و
هەرشەوێك لەباوەشی بەرپرسێکی
بێ ئابڕوو ڕۆژدەکاتەوە!
جاران نیشتیمان
ئافرەتێکی شۆخ و شەنگ و
دلۆڤان بوو
بەڵام ئێستا
لەلایەن زۆڵە پیاوێکەوە
مارەبەجاش کراوەتەوە
ڕۆڵەکانی لەسەرشۆستە و
شەقامەکان جێ هێشتووە

فێری سواڵی نامەردیان دەکات!
تا مێزی گەواد وگەندەڵەکان
برازێنێتەوە!

## نیشتمان

نامەوێت ئەم نیشتمانە
بۆ بەعسی و جاش بۆتە لانە
بە ڕۆژ لەئامێزی شیعە و
بەشەو ژنی ئەردۆغانە
پڕی حیزبی شڕ و دزە
سەریان شۆڕە و چاویان کزە
کام سەرکردەی بەئابڕووە
یا خائینە یا جاش بووە
بستێ خاکی خاوێن نییە
پڕ ناحەز و گەندەڵییە!

## کورد

ئەمڕۆ بەحیزبی کوردی دەنازی
سبەی بەدوژمن خۆزگە دەخوازی
نەخاك و خەڵك و نەخودا ڕازی
فریای کورد نەکەوت، نەشێخ نەقازی
کوا گۆڕانکاری کوانێ چاکسازی
گەندەڵی و دزی و مەی و مێبازی
گەلان ڕێککەوتن، بەس کورد نەسازی
هەر براکوژی بوویتە ڕێبازی
هەنگاو بۆ دوواوە بەرەو لاوازی
میللەت ناژی بەسواڵ و خێرخوازی

## ئاڵا

لەژێر سێبەری ئەم پەرچەمەی تۆ
گەندەڵخانەیە مەملەکەتی تۆ
لەپەنای ئاڵا
بووینە بە بەڵا
نیشتمان و نەتەوە بووینەتە کاڵا
بۆگیرفانی بەرپرسانی ئەملا و ئەولا

## باج

ماکەرەکانی نیشتمان

تەڕاتێنی سەرجۆغینی

ڕەوسەی میللەت باجی هەیە

هێندە مەیێن

هێندە مەرۆن

هێندە جووتەمان لێ مەدەن

لەدواییدا قەستەقولی

خۆتان دەخۆن!

٢٠٢٠/١٢/١٩

## نزا

دزە دێزە

چەموشەشا

شەوی یەڵدایە

تەمەنی شا

دار و دەستەی

بەرچیخەشا

بێتە فریا

مەگەر شای شا

ئابڕوو
دەرپێ دڕاوەکانی شار
پینەکەنەوە
دۆخینی پساوی پیاوانی دەسەڵات
گرێ دەنەوە
هەر بەدوای دامێنی
بێ ئابڕووەکان مەسووڕێنەوە
وڵات لەگەندەڵیدا
بۆگەنی کردووە!

٢٠٢٠/١٢/٢٠

## ئەوقاف

دەست بەریشتانەوە بگرن
با نەیسووتێنن!
مێزەرە سپی و پاکەکانتان
لەناوخوێندا دەخەڵەتێنن
بەرماڵەکانتان بەهێواشی
ڕاخەن و مەیتەکێنن
ئەوان مینبەر و مزگەوت
لەسیاسەتدا دەگەوزێنن!

٢٩،١،٢٠٢١ هەولێر

## حزب

شکۆمەندی نەتەوەیەك

چەند چەتەیەك هەڕاجیان کردا

هاتن هاتن

نیشتمانیان ناشیرین کرد

ئابڕووی شاخ و

مێژووی خەبات و

بەرخودانیان ڕیسواکرد

ئێستا ئێمە پەشیمانین لەڕاپەڕین

لەپێشوازی و لەهەلهەلەی هاتنەوەیان

پەشیمانین لەدەنگدان وهەڵبژاردن

چونکە ئەوان وەکو دوژمن ستەمیان کرد

نێومالّی کوردیان لێکترازاند

هەرچی بەهای بەرزی کوردبوو

هەرچی جوانی نیشتمان بوو

لەناویان بردا

هەڕاج
نیشتمان چەند بێ کەسە
هەموو درۆی بەدەمەوە هەڵدەبەستن!
دۆست و دوژمن دایدەدۆشن
لەسەر سنگی قوماردەکەن
مەی دەنۆشن ...
ڕۆژێ سەدجار دەیدۆڕێنن
دەیفرۆشن!

ماچ
چی خۆشترە لەتامی ماچ ؟
لەم هەرێمە لەسەر دوو ماچ
کوڕ و کچیان داوە لەخاچ!
بەڵام ماچی دەستی دوژمن
بۆ سەرکردە و سیاسی کورد
بۆتە هەڕاج
بەشەستە بارانی بەهاریش تەڕ نابن
وەکو دەشتی ووشکی قەراج!

## گەنی

لەم نیشتمانە بێ نازە
بەناو سەربەخۆ و ئازادە
بەدوای بستێ خاك و خۆڵی
پاكدا وێڵم
بۆ كڕنۆشێ
بۆ نزایێ
پەرستشێ
یا دیداری خۆشەویستێ
یا ژووانێ
بۆیە گەلۆ
من ناچارم سەرهەڵگرم
بەجێی بێڵم!

## نیشتمان دزرا

كێ دزی؟
پاسەوان!

## نیشتمان زڕ دایکمە

لەو ڕۆژەی حزب

بەزۆری خۆی کرد

بە باوکم!

## شکۆ

نیشتمانی شکۆ شکاو

بێ دەسەڵات،

ئابڕوو تکاو!

بەهای تۆیان فرۆشتووە

چی بەرپرسی بەرسەرچووە،

لەئامێزی تۆ خەوتووە

زۆر بێزاری

لەداخانا گۆڕت بۆ خۆت هەڵکەندووە .

٢٠٢١/١١/٢٢

هەولێر

## دایك

وەرە و ئەمشەو میوانم بە

سەر دەنێمە ژێر هەردوو پێت

چەند تا مەزۆری ئەوینێکم

بۆنی بەهەشت لەژێر پێی بێت!

تەنها یەك شەو میوان بە

بۆنی سینە و خەنە و مێخەك

بەسەرمدا ببارێنە

شەوێ وەرە و

بەلای لایە

لەباوەشی میهرەبانیت

بەئارامی بمخەوێنە

وەکو سەردەمی منالّی

هێدی هێدی

دەست بە سەر و ڕووخسارمدا دابهێنە

شەوێك وەرە

هەرچی خەمی تەمەن هەیە

لەئامێزی دایکایەتیت

بەبێ دەنگی برەوێنە.

## دڵی دایك

لەنێو بووخچەکەی دایکمدا

سووراو نەبوو

داوی برۆ و

بۆن و مەرهەمی عەتار و

درۆی عاشقانە نەبوو

جگە لەکل وکلدان،

دەستە جلێکی کوردی،

سابوونێکی حەلەب و

خەناوەکەیەکی قەنەفر

پڕ دڵسۆزی و

پڕ عەشق بوو!

٢٠٢٠/٩/٦

## ئیلاهی

هێندەم لەدەرگای غەیری تۆدا

ڕووم نییە بێمە دەرگات

گەرچی دەرگات

والآیە لەسەر پشتە هەمووکات

## گوناه

یا ئیلاهی!

بمبەخشە،

لەبەر گوناهـ ناتوانم لێت بڕوانم

بمخەرەوە سەر هەمان ڕێگەی

عەشقی خۆت

ئیتر پەشیمانم!

## پەرستن

نە لەترسی دۆزەخ

نە لەخۆشی بەهەشت

تۆ ناپەرستم

تۆ خودامی

خۆشم دەوێی

هەر لەبەر خۆت

دەتپەرستم

## بێدار

یا ئیلاهی
بێدارمکەوە
ڕامچلەکێنە
خەریکە خۆپەسەندی دەمکوژێ
لەتەزکیە و زوهد و ڕەبانیی بووندا دوورم
دڵم بۆغەیری تۆ دەسووتێ.

## دوژمنی شەرع

تۆ دوژمنی شەرع و ژنی
پەیامبەرێکی ساختەچی و نێر دراوێکی درۆزنی
خۆت بە کەوشی پیسی ئیبلیس
هەڵواسیوە
دەیان بتی بێ باوەڕیت
بوی تاشیوە
شەڕخوازێکی دۆڕاوی
سەر شۆڕێکی داماوی
بە کاروانی شکۆ حەپی
تۆ ناگەی بە کەوشی نەبی

٢٠٢٠/٤/٥

## مردن

سەفەرێکم گرتۆتە بەر

بۆ مەبەستێك هەنگاو دەنێم

توێشووی ڕێگام

هەر باوەڕە

حەقیقەتێ دەگەیەنم

گرینگ نییە من کەی دەمرم

لە کوێ دەمرم

بە چی دەمرم

من دەزانم

لە پێناو چیدا دەمرم

تاوانی کەس هەڵناگرم

بە ئومێدی بەخشینی خودام

پاداشتی بێ سنوور وەرگرم

لە حەشریشا لەگەڵ یاران

دەوروبەری رەسول بگرم

٢٠٢٠/٤/٥

## ئامانج

دەمەوێت ئەسپی سەرکەشی

ئارەزووەکانم ڕام کەم

تەمەنێکە هەر خەریکی

درۆ و دووروویی و غەشم

هەرگیز تۆ نابیت بەهی من

تاکو خۆم بەتۆ نەبەخشم

دەمەوێت لەسروشت فێری بەخشین بم

زۆرم پاشەکەوت کرد

کەچی لەهەمووی بێ بەشم

ئەوەی دوێنێ

بەدەستی خۆم ناشتم

ئەمڕۆ لەدرەوی پەشیمانم!

زۆر لەگەڵ ژیان جەنگاوم

چیتر نامەوێت بدۆڕێم

لەسەرکەوتن ماندوو نابم

هەر بەدوای لووتکەی

بەختەوەریدا دەگەڕێم

وا لەڕێم
دڵنیامە هەرپێی دەگەم
لەنهێنی عەشقی خودا
هەرتێدەگەم

٢٠٢٠/٩/٩

## دایك

کێ دەتوانێت
دایکمم بۆ بێنیتەوە؟
کامە ژنی میهرەبان و
دڵسۆز هەیە
شوێنی دایکم دەگرێتەوە؟
کەس بۆنی ئەوی لێ نایەت
هیچ ئامێزێك
نەرمی و ئارامی
ئەوم بۆ ناهێنێتەوە!
دایك بڕاندی خودایە
کەس ناتوانێت کۆپی بکات
یا لەبەری بگرێتەوە .

٢٠٢٠/٨/٨

## تەریقەت

وەرن یاران کۆڕی زیکرە
زیکری باری، حاڵی فکرە
فکری دەوری ئوحد و بەدرە
یادی یاری غاری سەورە
هیلالی ڕووی پڕ لەنوورە
نووری سینەی دیاری دوورە
زوهدی رۆحی بۆ ئەوبەرە
عیلاجی سەر دەردی دەورە
دەروێشانی تەریقەتی
رەسولی ناز ئەبوبەکرن
یەکتا و ویستی خواپەرستی
نێو خەڵوەتی شەوی قەدرن
شەرمەندەی بەرقاپی ڕەببن
بەئومێدی عەفووی حەشرن
یا ئیلاهی هەر تۆی پەنا
هەم بۆ ئێرە هەم بۆ ئەولا
تاجی ڕێز و بەخشینی شا
ڕێی فیردەوس و بینینی خوا

٢٠٢٠/٧/٢٤

## خودا

یا ئیلاهی

من تۆم هەبێت

چیم داوە لەچی تر؟

تۆ هەمووی و

لەهەمووی هەمووترا

## هاودەم

چیم بەچی کرد

هەرچی دەرگا هەبوو لێمدا کەچی

لەڕووم نەهات بێمە دەرگات

ووتم هیچم بۆچی....

من تۆم هەبێت

چیمداوە لەچی ؟

جگە لەتۆ هەمووی هیچە

هیچم بەچی....

گەر بمکەیتە هاودەمی خۆت

چی دەبێ چی؟

## توانەوە

من نە مەحوییم
لەخەڵوەتی عەشقی پاکت بمێنەوە
نە نالیشم
بۆحەبیبەی دڵی شیعر
شیعری تەڕ و سەرقافلەیی بهۆنمەوە....
من هەر ئەوەم کە هەر ئەوەم
ئیتر بۆچی لەدووری تۆ بمێنمەوە؟
یا ئیلاهی
دەستم بگرە
با لەعەشقی کەسێکی تر نەتوێمەوە!

## دایك

لەدوورەوە چاوم لێتە
دڵم ئاگا و
پاسەوانی چاو و ڕێتە
چەند دڵسۆزی....
پڕ پیرۆزی...
بۆیە بەهەشت لەژێر پێتە!

٢٠٢٠/٧/٢٨

## چەتر

ئەگەر ئەمساڵ باران باری

نابێ چەتری بۆ هەڵبدەین

چڵکی گوناهـ هێندەی گرتووین

بەسەد بارانیش تەڕنابین؟

## سەروەر

بڕژێنە گوڵاوی سەروەر

وەك بارانی یەكەم وەرزی وشكەساڵی

بۆ سەر دڵی عاشقانی

تامەزرۆی دیداری پێغەمبەر

بە بۆن و بەرامی نازدار

تەڕكە هەواری كورد

با بڵێن هاتە ئەمساڵ

بەرهەمی یادی سەروەر.

## هۆشیار

پێنووسێك و

قورئانێك و

چەند پەیڤێكی شیرینی پێغەمبەر و

ڕەوشت بەرزی

زاری پاك و

دەستێكی بەخشندە و

مێزەرێكی سپی و

كانگای دڵسۆزی

لاپەڕەی كردەوەكانت

پڕیەتی لەسەروەری

تۆشایانی گەڕانەوەی هاوڕێی بەرز و

فریشتەكانی فیردەوسی

خۆ تۆ تەمای تاجی هیچ پادشایێ نەبووی

تەمای كورسی هیچ سەركردە و

سەرۆكی هیچ وڵات نەبووی

تۆ كەدڵ و خۆشەویستی

خەڵكت هەبوو

جێنشین و میراتگری پێغەمبەر بووی

ووتاربێژی سەر مینبەر و
میحرابەکەی موحەممەد بووی
چ پێویستت بەئارەزوو و پۆستەکانی دونیا هەبوو؟
تۆ دەتویست دادپەروەری و خۆشەویستی
بەرپا بکەی
برایەتی و ئازادی بێنێتە دی
تاوانی تۆ
هەر ئەوەبوو!

٢٠٢١/١١/٢١

## عەشق

نە لەترسی دۆزەخ
نە لەخۆشی بەهەشت
تۆ ناپەرستم
تۆ خودامی
خۆشم دەوێی
هەر لەبەرخۆت دەتپەرستم.

## عەشق

ئەگەر عەشقی غەیری خودا

پەسەند بوایە

ڕێگەی دەدا پێغەمبەریش جگە لەخوا

عەشقی کەسانی تر بوایە

ئەوسا دەبوو

لەنێو یەك دڵ

جێگەی دوو عەشقی تیا بوایە

٢٠٢١/٤/١٥- هەولێر

## گەرانەوە

یا ئیلاهی!

هەموو شەوێ دادەبەزی

بۆ ئاسمانی لێڵی بەندە

من بێ ئاگا و

تۆش چاوەڕوان بێمە حزوور

بڵێم خوایە لێم ببوورە

من گوناهبار

تۆش بەخشندە.

# ژیاننامەی شاعیر

**محسن حمدامین حسین ناسراو بە (موحسین شوانی)**

- لەساڵی ١٩٧١لە قەزای مەخموور هاتۆتە دونیاوە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی و ئامادەیی لە مەخموور تەواوکردووە.
- دبلۆمی لە ڕاگەیاندن وەرگرتووە.
- زیاتر لە ٢٠ساڵ خزمەتی مامۆستایەتی هەیە.
- لەساڵی ١٩٨٤ دەستی بەشیعر نووسین کردووە و یەکەم شیعری لەساڵی ١٩٨٧لە گۆڤاری کاروان بڵاوکردۆتەوە.
- تا ئێستا ١٠ بەرهەمی شیعری بەچاپ گەیاندووە.
- جگە لەشیعر لەبوارەکانی هونەری میوزیك و شانۆ و ڕۆژنامەنووسی و ڕاگەیاندن کاردەکات.
- ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستانە.
- ئەندامی سەندیکای هونەرمەندانی کوردستانە.
- ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کوردە.
- هەشت ساڵ پەیامنێری کەناڵی ئاسمانی سپێدەبووە.

- له زۆربەی ڕۆژنامه وگۆڤار و سایتەکان شیعر و وتاری بڵاوکردۆتەوە.

بۆ خوێندنەوەی زیاتر و ئاشنابوون بەشیعر و بەرهەمەکانی:

**Facebook\ muhsin shwany**

**Instagram\ muhsin shwany**

**Youtube\ muhsin shwany**

**Twitter\ muhsin shwany**

**Phone\ 07504787213**

